# Dos

## سەرەتایەك لەسەر Dos

Dos چی یە؟

Dos کورت کراوەیی Disk Operating System ، وە بۆ یەکەم جار لە ساڵی 1981 دا داهێنرا وەك یەکەمین بەرنامەی وەگەڕخستن بۆ بەکار هێنانی کۆمپیوتەر،
بەکورتی بەرنامەی Ms-Dos بەرنامەیەکی وەگەرخستنە وەك بەرنامەی Windows یان هەر بەرنامەیەکی تر بەلاّم لەرِوییەکی ترەوە بەرنامەی Ms-Dos بەتەواوی جیاوازە لە بەرنامەکانی تر بەهۆی ئەوەی کە بۆ داخل کردنی فرمانەکانی تەنها پشت بە Key Board دەبەسین بیّ ئەوەی Mouse بەکاربهێنین .

## ناوی فایلەکان لە Ms-Dos دا

ناوی فایلەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە:-

بەشی یەکەم:-

بەشێکی بنەڕەتی یەو نابێت درێژیەکەی لە (1) پیت کەمتر بێت وە ئەم بەشە ناوی فایلەکانە زۆر پیّویستە و ناتوانرێت نەنوسرێت.

بەشی دووەم:-

بەشیکی درێژکراوەییەو و درێژیەکەی لە (3) پیت زیاتر نیە وە پیّویستە ئەم بەشە لەگەڵ ناوە بنچینەیی یەکەدا بە خاڵێك لیك جیا بکرێتەوە، ئەمەش بەشێکی بنچینەیی نیەو دەتوانرێت نەنوسرێت.

بۆ نموونە:        AutoCad . txt

بەشی دووەم        بەشی یەکەم

لێرەدا هەندێك لە بلاّوترین جۆری ئەو ناوە درێژکراوانە کە لەگەڵ ناوە بنچینەیی یەکاندا دەنوسرێن و ڕونی دەکەینەوە:

| | | |
|---|---|---|
| فایلی ئەو فرمانانەی کەبەیەکەوە جێبەجێ دەکرێن | BATCH | BAT |
| فایلی پرۆگرام | COMMAND | COM |
| فایلی ئامادەیی بۆ جێ بەجێ کردن | EXECUTABLE | EXE |
| فایلێکی نوسراو یان بەڵگەنامەیی | DOCUMENT | DOC |
| فایلی نوسراو | TEXT | TXT |
| فایلی سەرچاوەی پرۆگرام کە بە زمانی کۆکراوە نوسراوە | ASSEMBLY | ASM |
| فایلی یەدەگ ( سپێر ) | BACKUP | BAK |
| فایلی بەرنامەی BASIC | BASIC | BAS |
| فایلی ( بنکەی زانیاری ) داتا بەیس | DBASE FILE | DBF |
| فایلێکی نوسراو بەزمانی پاسکاڵ | PASCAL | PAS |
| فایلی دروست کردنی سیستەم | SYS | SYS |
| فایلێکی نوسراو بەزمانی C | C | C |

هەروەکو ئەزانین کۆمپانیاکانی کۆمپیوتەر بەردەوام لە پیشکەوتندان و
بۆیە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بەردەوامە لەدەرکردنی ڤێرژنی نوێی Dos ی کۆمپیوتەر

# ڤێرژنەکانی ( DOS ):

| ڤێرژنی دۆس ( DOS Version ) | ساڵەکەی |
|---|---|
| QDOS | 12/1980 |
| 86-DOS | 07/1981 |
| MS-DOS 1.25 | 09/1982 |
| MS-DOS 2.0 | 03/1983 |
| MS-DOS 2.01 | 11/1983 |
| MS-DOS 2.11 | 12/1983 |
| MS-DOS 3.0 | 09/1984 |
| MS-DOS 3.1 | 11/1984 |
| MS-DOS 3.2 | 04/1986 |

| | |
|---|---|
| MS-DOS 3.3 | 04/1987 |
| MS-DOS 3.31 | 04/1988 |
| MS-DOS 4.0 | 07/1988 |
| MS-DOS 4.01 | 11/1988 |
| MS-DOS 4.01a | 04/1989 |
| MS-DOS 5.0 | 04/1991 |
| MS-DOS 6.0 | 03/1993 |
| MS-DOS 6.2 | 11/1993 |
| MS-DOS 6.22 | 04/1994 |
| MS-DOS 7.0 | 08/1995 |

جگە لەمەش تۆ ئەتوانی ڤێرژنی نویٚ لە ئینتەرنیٚت ( Download ) بکەی و ( Setup )ی بکەی. هەر لەسایتی Google بنووسە ( Download MS-DOS v7.0 ).

ئامادەکردنی : سرود مستەفا کریم
Email: srudcpp@yahoo.com

ئامادەکردنی:سرود مستەفا کەریم
قۆناغی چوارەم
زانستی کۆمپیوتەر
ئیمەیل: Srudcpp@yahoo.com

# بەشی دووەم

# فرمانەکانی بەرێوەبردنی فایل

# فرمانەکانی بەڕێوەبردنی فایل
# File Handling Commands

دەگونجێت فرمانەکانی بەڕێوەبردنی فایل دابەش بکەین بۆ فرمانی دەرەکی و ناوەکی کە ئەمانەن:

## فرمانە ناوەکیەکان:

فرمانی پیشاندانی فایلی حازر لەسەر (هارد یا میمۆری) ........................... **DIR**
فرمانی دروستکردنی نوسخەیەکی تر لەفایل................................ **COPY**
فرمانی پاشگەزبوونەوەی فایل............................................ **DEL**
فرمانی دووبارە ناولێنانەوەی ............................................ **REN**
فرمانی پیشاندانی ناوەرۆکی فایل لەسەر شاشە................................ **TYPE**

## فرمانە دەرەکیەکان:

فرمانی پیشاندانی فایل لەسەر شاشە بەشێوەی(**Page Page**)................ **MORE**
فرمانی چاپکردنی سەردێری فایل لەسەر جیهازی چاپەمەنی..................... **PRINT**
**پیشاندان و گۆڕینی تایبەتمەندییەکانی فایل** ......................... **ATTRIB**
گواستنەوەی ناوەرۆکی فایل بۆ ناوەرۆکیکی تر .................................. MOVE
کۆپیکردنی ناوەڕۆکی فایل و ناوەڕۆکە لقیەکان .................................. XCOPY
ئامادەیی بۆ ڕەشنەکرانەوەی فایل ......... ............... ......... UNDELETE

ئێستا هەڵدەستین بەشیکردنەوەی بەشی بەڕێوەبردنی فایل بەیارمەتی فرمانەکان کەئیستا دەستدەکەین بەشیکردنەوەی بە تەواوی و جێبەجێ کردنی هەریەکە لەمانەی خوارەوە:

1- کۆپیکردنی فایلێك لەسەر فایلێکی تر
2- پیشاندانی فایل لەسەر شاشە
3- لابردنی هەر فایل(واتە ڕەشکردنەوەی)
4-گۆڕینی ناوی فایل
5- دروستکردنی فایل
6- کۆپیکردنی فایل لەسەر جیهازی چاپەمەنی

پێش ئەوەی دەست بکەین بە باسکردنی وانەکان دەبێت بزانین ئەو دەگمانەی کەلەسەر کیبۆرد ئیشمان پێی دەبێت لە MS-DOS ئەمانەن:

F1 : بەکاردێت بۆ دووبارە بەکارهێنانەوەی کۆماندەکانی پیشتر کە جێبەجێتکردووە لە شاشەی MS-DOS

F7 : بەکاردێت بۆ دووبارە بەکارهێنانەوەی کۆماندەکانی پیشتر کە جێبەجێتکردووە لە شاشەی MS-DOS

## یەکەم : فرمانە ناوەکیەکان

### 1- فرمانی پیشاندانی ناوی فایلی حازری سەر هاردکان DIR

ئامانجمان لەبەکارهێنانی: بۆ پیشاندنی ناوی هەموو فایل و فۆڵدەرەکانی سەر ئەو هاردەی کە ئێمە دیاری دەکەین لەسەر شاشە لەگەڵ هەندێك زانیاری لەسەر فایلەکان

جۆری فرمان : فرمانی ناوەکی

شیوەی گشتی: DIR /p | /w | /o | /a | /os | /s | /ah | /as | /ad | /aa

**شێوەی بەکارهێنانی**

| فرمانەکە | ڕوونکردنەوە |
|---|---|
| Dir/p | پیشاندانی فایلەکان بەشێوەی (page) (page) |
| Dir/w | پیشاندانی فایلەکان بەشێوەی عاموودی(پێنج عاموود ) لەگەڵ نووسینی ناوی فایلەکان بەتەنها |
| Dir/o | پیشاندانی فایلەکان بەشێوەی ڕێکخستنی حروفی ئەبجەدی |
| Dir/a | پیشاندانی هەموو فایلەکان تەنانەت فایلە بزرکراوەکانیش (Hidden) |
| Dir/os | پیشاندانی فایلەکان بەشێوەی قەبارەکەی (فراوانیەکەی) لەگەورەوە بۆ بچووك |
| Dir/s | پیشاندانی هەموو ناوەرۆکی ناو فایل و فۆڵدەرەکان |
| Dir/ah | پیشاندانی تەنها فایلە شاراوەکان (Hidden) کراو |

| | |
|---|---|
| Dir/as | پیشاندانی تەنها فایلەکانی سیستەم |
| Dir/ad | پیشاندانی تەنها فۆڵدەرەکان بەبێ پیشاندانی فایلەکان |
| Dir/aa | پیشاندانی تەنها ئەو فایرنەی کە بەشێوەی ئەرشیف خەزنکراون، ئەمەش هەموو جۆرەکانی فایل دەگرێتەوە نەك فۆڵدەر |

نموونە1:

**D:\>cd Sound**

**D:\Sound>dir/aa**

تێبینی: وە دەتوانین دوو فرمان تێکەڵ بکەین بۆ نموونە2:

ئەگەر بمانەوێت بەشێوەی حروفی ئەبجەدی ریزیان بکەین وە لەهەمان کاتیشدا بەشێوەی پێنج عەموودیش بێت، ئەوا دەنوسین:

**D:\>Dir/o/w**

نموونە3:

بۆ بەدەرخستانی ناوی هەموو فایلانەی کەبە پاشگری EXE کۆتایی هاتووە لەسەر شاشە راوەستانی لەدوای هەر (Page)ێك، ئەم فرمانە بەکاردەهێنین:

**C>DIR *.EXE /p**

نموونە4:

بۆ بەدەرکەوتنی ناوی هەموو ئەو فایلانەی تەنها یەك ووشەیە واتە(**length**ی ناوەکەی یەك ووشەیە ) ئەم فرمانە بەکاردەهێنین

**C> DIR ?.**

نموونە5:

بۆ پیشاندانی ناوی هەموو ئەو فایلانەی کەلەناو فۆڵدەری Sound هەیە لە هاردی **:D**

**D:>dir sound**

## 2- فرمانی دروستكردنی كۆپیەك لە فایلەكەمان COPY

**ئامانجمان لەبەكارهێنانی:** دروستكردنی نوسخەیەكی ترە لەفایل.

**جۆری فرمان :** فرمانی ناوەكی.

**شێوەی گشتی :** COPY file1 file 2 [/v]

**لەكاتێكدا :**

**file1** ناوی ئەو فایلەی كەدەمانەوێت نوسخەیكی لەسەر بكەین .

**file2** ناوی فایلی نویێ كەلەسەر فایلەكەی سەرەوە دروستكراوە(**file1**) .

**V /** بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ فرمانی **COPY** دا،بۆ جیێ بەجیێ كردنی كرداری نوسخەكردنەكە،بەلاَم ئەگەر نەشی نووسی هەر هەڵە نابێت.

**نموونە:**

أ) بۆ نوسخەكردنی فایلێك بەناوی **CHKDSK.COM** بۆ فایلێكی تر بەناوی **XYZ.COM** بەم شێوەیە دەینوسین:

**C> COPY  CHKDSK.COM  XYZ.COM .**

ب) بۆ نوسخەكردنی هەموو ئەو فایلانەی كە كۆتاییان هاتووە بەپاشگری **PAS** بۆ ئەو فایلانەی كەبە پاشگری **BAK** كۆتایی هاتووە بەم شێوەیە دەینوسین:

**E>  COPY    *.PAS   *.BAK**

ج) وە ئێمە دەتوانین دوو فایل نوسخە بكەینە ناو یەك فایل:

واتە: **COPY file1 + file2   file3**

نموونە: D> COPY srud.txt + Masud.txt   Mahmud.txt

واتە فایلی Mahmud.txt نوسراوەكانی هەردوو فایلەكەی سەرەوەی تێدایە

تێبینی : يمكن استخدام الأمرCOPY لانشاء ملف جديد وذلك عن گريق استخدام الاسم CON

## 3- فرمانی رەشكردنەوەی فایل DEL

**ئامانجمان لەبەكارهێنانی :** رەشكردنەوەی هەر فایلێك لەناو بەشەهاردەكان یا میمۆری .

**جۆری فرمان:** فرمانی ناوەكی .

شێوەی گشتی : DEL file name

لەكاتێكدا : .. file name   ناوی ئەو فایلەیە كەدەمانەوێت رەشی بكەینەوە .

نموونە:

أ) ئەگەر ویستت فایلێك رەشبكەیەوە بەناوی SAID44.PDF   لەسەر بەشە هاردی :D ئەم فرمانە بەكاردێت:

D>DEL SAID44.PDF

ب) بۆ رەشكردنەوەی هەموو ئەو فایلانەی بۆنموونە لەسەر بەشە هاردی:E هەیە و دەستپێدەكەن بەووشەی

DISKوە ژمارەی پیتەكانیان 7 پیتە  بەم شێوەیە دەینوسین:

E>DEL    DISK???.*

ج) بۆ رەشكردنەوەی هەموو فایلەكانمان لەسەر هەر بەشەهاردێك (واتە رەشكردنەوەی تەنها فایلەكان نەك

فۆڵدەرەكان ) ئەم فرمانە بنووسە:

E>DEL *.*

د) بۆ ڕەشکردنەوەی هەموو ئەو فایلانەی کە تەنها کۆتاییان هاتووە بە پاشگری بۆنموونە (TXT.) لە ناو هاردی :E بە شێوەیە دەینوسین:

E>DEL *.TXT

## 4- فرمانی گۆڕینی ناوی فایلی سەر بەشەهاردەکان REN

**ئامانجی بەکارهێنان:** گۆڕینی ناوی فایلی سەر بەشەهارد یان میمۆری.

**جۆری فرمان :** فرمانی ناوەکی .

**شێوەی گشتی :** REN old file new file

**لەکاتێکدا :** old file ناوی ئەو فایلەی کەدەمانەوێت ناوەکەی بگۆڕین .

new file ناوی فایە نوێ یەکە .

نموونە:

أ) لەبۆ گۆڕینی ناوی فایلی SAID.TET بۆ SAID1.DOC ئەم فرمانە بەکاردەهێنین:

E> REN SAID.TET SAID1.DOC

ب) بۆ گۆڕینی ناوی هەموو ئەو فایلانەی کە کۆتایان هاتووە بە پاشگری LST لەبۆ هەمان ناو بەلاّم بۆ پاشگرێکی تری وەکو PRN بەم شێوەبە دەبێت:

E> REN *.LST *.PRN

## 5- فرمانی دەرختنی ناوەڕۆکی فایل TYPE

**ئامانجی بەکارهێنان :** پیشاندانی ناوەڕۆکی فایل لەسەر شاشە.

جۆری فرمان : فرمانی ناوەکی .

شێوەی گشتی : TYPE [ File name ]

حیپ ـ:

File name ناوی ئەو فایلەی کەدەمانەوێ ناوەرۆکەکەی نیشاندەین.

نموونە:

بۆ دەرخستنی ناوەڕۆکی فایلی SAID حازری سەر هاردی بۆنموونە :E لەسەر شاشە ئەم فرمانە بەکاردەهێنین E>TYPE SAID1

## دووەم : فرمانە دەرەکیەکان

### 1- فرمانی پیشاندان MORE

ئامانجمان لەبەکارهێنانی: ئەم فرمانە بەکاردەهێنین بۆ پیشاندانی فایل لەسەر شاشە بەشێوەی (Page page).

جۆری فرمان : فرمانی دەرەکی .

شێوەی گشتی : [ DOS COMMAND] | MORE

نموونە:

أ) E> DIR | MORE .

دەبێت ناوەڕۆکی سەر بەشەهاردەکان نیشان بدات بەشێوەی پەڕ لەدوای پەڕ(Page step page)

پاشان دەست دابگرە لەسەر دوگمەی ENTER چونکە دەزانین نیشانەی | واتە (Piping)واتە دەبێت یەکەم (Page)نیشان بدرێت لەفایلەکە وە لەکۆتاییەکەشی نیشانەی ---MORE--- دەنوسرێت

ب) لەدوای دەرکەوتنی نیشانەی ---MORE--- پیشاندانی ناوەڕۆکی ئەم (Page)، ئەوا هەر دوگمەیەکی تر دابگرە بۆ چوون بۆسەر سەفحەکەی تر، وە هەروەها لەکۆتاییەکەشی هەمان نامەت دەداتێ.

---MORE---

بەهەمان شێوە تاوەکو کۆتایی فایلەکە.

ج) E> SAID.COM | MORE or MORE < SAID.COM

سوف تظهر اول صفحة في الملف المسمى SAID.COM وفي نهايتها كلمة ---MORE---.

لەپاش گەیشتن بەناوەڕۆکی (Page)یەکەم وە بەدەست داگرتن لەسەر هەر دەگمەیەکی تر دەتوانین ناوەڕۆکی (Page)دووەم نیشان بدەین لەسەر شاشەکە، وە بەهەمان شێوەش لەکۆتاییەکەی هەمان نامە دووبارە دەبێتەوە ---MORE--- .

وە بەهان شێوە تاوەکو کۆتایە فایلەکە.

## 2- فرمانی لەچاپدانی فایل PRINT

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی:** ئەم فرمانە بەکاردەهێنین بۆ لەچاپدانی ناوەڕۆکی فایلی نوسراو .

**جۆری فرمان** : فرمانی دەرەکی.

**شێوەی گشتی** : PRINT[file name ][device name]

نموونە:

C:\PRINT Autoexec.bat on LPT1

لەکاتێکدا:

Autoexec.bat ناوی ئەو فایلەیە کەدەمانەوێت لەچاپی بدەین.

LPT1 ئەو پۆرتەیە کە ئەو جیهازەی لۆ چاپکردن بەکاردێ پێوەی دەبەسترێت .

## 3– فرمانی پیشاندان و گۆڕینی تایبەتمەنیەكانی فایل ATTRIB

ئامانجمان لەبەكارهێنانی : بەكاردێ بۆ پیشاندان و گۆڕینی تایبەتمەندیەكانی فایل

جۆری فرمان : فرمانی دەرەكی .

شێوەی گشتی : ATTRIB ( + or - ) [/H] [/A] [/S] [/R]

نیشانەی + دادەنرێت بۆ پێدانی تایبەتمەندی داهاتوو بە فایل ، وە نیشانەی – بۆ رەشكردنەوەی تایبەتمەندی داهاتوو .

لەكاتێكدا :

[H] هەلدەستێ بە گواتنەوەی فایلەكە بۆ فایلێكی بزركراو (Hidden)

[A] هەلدەستێ بە گواتنەوەی فایلەكە بۆ فایلی (ارشیف)

[S] هەلدەستێ بە گواتنەوەی فایلەكە بۆ فایلی (System)

[R] هەلدەستێ بە گواتنەوەی فایلەكە بۆ فایلێك تەنها بخوێندرێتەوە(Read Only)

**نموونە:**

أ) ئەگەر بمانەوێت فایلێك بەناوی ABD.EXE بشارینەوە (Hidden) بكەین ئەم فرمانە بەكاردێ:

C:\ ATTRIB +H ABD.EXE

ب) ئەگەر فایلی ABD.EXE بتەوێت بكەینە فایلێك كە(Hidden) نەبێت بەم شێوە دەبێت:

C:\ ATTRIB -H ABD.EXE

## 4– فرمانی گواستنەوەی فایل بۆ شوێنێكی تر MOVE

ئامانجی بەكارهێنان: بۆ گواستنەوەی فایلێك یان چەند فایلێك بۆ شوێنێكی تر.

جۆری فرمان : فرمانی دەرەكی

شێوەی گشتی : MOVE [ path1 ] [ file name ] [ path2 ]

لەكاتێكدا :

[ path1 ] ئەو شوێنەی كە دەمانەوێت فایلەكەی لێ ببەین

[ file name ] ئەو فایلەی كە دەمانەوێت نەقلی بكەین

[ path2 ]ئەو شوێنەی كە دەمانەوێت فایلەكەی بهێنینێ

نموونە:

أ) بۆ گواستنەوەی فایلی AAA.TXT لەناو فۆڵدەری DATA بۆناو فۆڵدەرێكی تر بەناوی INFO ئەم فرمانە دەنوسین:

C:\ MOVE C:\DATA\AAA.TXT C:\INFO

ب) بۆ گواستنەوەی هەموو فایلەكانی ناو فۆڵدەری ISI بۆ ناو فۆڵدەرێكی تر بەناوی WIN ئەم فرمانە دەنووسین:

C:\ MOVE C:\ISI*.* C:\WIN

تێبینی: دەشتوانی گواستنەوەكە لەنێوان بەشە هاردێك بۆ بەشە هاردێكی تر یان بۆ میمۆری بێت یان بە پێچەوانەوە

بۆنموونە:

بۆ گۆاستنەوەی فایلێك بەناوی (AutoCad.pdf) لەهاردی :D بۆناو فۆڵدەرێك بەناوی (Sound) لەهاردی :E ئەم فرمانە بەكاردەهێنین:

C:\ MOVE D:\AutoCad E:\Sound

## 5- فرمانیكی تری دروستكردنی نوسخەیەكی تر لە فایل XCOPY

**ئامانجی بەکارهێنان:** دروستکردنی نوسخەیەکی تر لە فایلەکەمان .

**جۆری فرمان :** فرمانی دەرەکی .

**شێوەی گشتی :** C:\XCOPY [ path1 ] [ files ] [ path2 ] [/s]

**لەکاتێکدا:**

**path1** ناوی ئەو ناونیشانەی کە ئێمە دەمانەوێت فایلەکەی لێ نوسخە بکەین .

**files** ناوە ئەو فایلەی کە دەمانەوێت نوسخەی بکەین .

**path2** ناوی ئەو ناونیشانەی کە ئێمە دەمانوێن فایلە نوسخەکراوەکەی ببەینێ .

**/ S** بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ فرمانی **XCOPY** ، بۆ نوسخەکردنی فۆڵدەرە فەرعیەکانی ناو فۆڵدەرێك، واتە ئەگەر فۆڵدەرێکمان هەبێت بەناوی **W** وە لەناو فۆڵدەری **W** سێ فۆدەری ترت هەبێت کە هەر فۆدەرێك لەو سێ فۆڵدەرانە فایلیان تێدابێت، ئەگەر لەگەڵ فرمانە **/S** بەکارهێنا ئەوا ئەم سێ فۆڵدەرەش نوسخە دەکات بە پێچەوانە کۆپی ناکات.بەلاَم ئەگەر ئەم سێ فۆڵدەرەی فەرعیەی باسمان کرد بەتاڵ بوو دیسان نوسخەی ناکات پێویستە فایلیان تێدابێت.

**نموونە:**

ئەگەر بمانەوێت هەموو ئەو فایلانەی لەناو فۆڵدەری **DOS** دا هەیە لە هاردی **:D** نوسخەی بکەینە ناو فۆڵدەرێکی تر بەناوی **DATA** لە هاردی **:E** لەگەڵ نوسخەکردنی هەموو فایلە فەرعیەکانی ناو فۆڵدەری **DOS**

**C: XCOPY D:\ DOS\ *.* E:\DATA /S**

Or **C: XCOPY D:\ DOS E:\DATA /S**

**تێبینی :**

فرمانیXCOPY گرینگترە لە فرمانی COPY کە هەڵدەستێ بە نوسخەکردنی ئەو فایلانەی کە ئێمە دەمانەوێت و گواستنەوەیان بەشێوەی کۆمەڵە، لە کاتێکدا فرمانیCOPY فایلەکان دەخوێنێتەوە بەشێوەی فایلی تاك (واتە یەك یەك فایلەکان دەخوێنێتەوە) پاشان هەڵدەستێ بەنوسخەکردنیان بۆ شوێنێکی نوێ.

بەلاَم فرمانی XCOPY کۆمەڵە فایلێك لەیەك کاتدا دەخوێنێتەوە پاشان خەزنکردنیان لەمیمۆری کە هەڵدەستێ بەخەزنکردنی کۆمەڵە فایلەکە پێکەوە لەیەك کاتدا لەشوێنێکی نوێ بەلاَم ئەم کردارە کاتێکی زۆرتری پێویستە بۆ کرداری نوسخەکردنەکە.

## 6- فرمانی گەڕانەوەی فایلی رەشکراو UNDELETE

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی:** گەڕانەوەی فایلێك کەڕەشکراوەتەوە کەدەتوێت بۆ جارێکی تر بیگەڕێنیەوە

**جۆری فرمان** :فرمانی دەرەکی .

**شێوەی گشتی** : UNDELETE

**لەکاتێکدا :**

أ) کە ئامێرەکەمان(کۆمپیوتەر) هەڵدەستێ بە پێدانی نامەیەك لەوکاتەی کەتوشی تێکچونی هەبوونی فایلە رەشکراوەکان دەبێت(وجود ملفات محذوفة) :

NO ENTIRES WERE FOUND

ب) بەلاَم لەکاتی هەبوونی فایلە رەشکراوەکان دەبێت کۆمپیوتەرەکەمان هەستێ بەداواکردنی ناوی فایلی رەشکراو بەبێ حەرفی یەکەم واتە لەجێگای حەرفی یەکەم نیشانەی ( ? ) دابنێ و وەبۆ گەرانەوەی فایلەکە لەسەر بەکارهێنراوەکە ئەوا حەرفی یەکەم داخلْ بکە لەناوی فایلەکەمان، ئەمەی خوارەوە واتە کاتێك کە فایلێك دەبێت گەڕابێتەوە :

**Directory: C:\WINDOWS**

**File Specifications: *.***

**?UTOEXEC BAT 543 8-26-96 2:09p ...A Undelete (Y/N)?**

ج) بەلاٌم كاتێك فایلێك كەناتوانریٚ بگەڕێندرێتەوە ئەوا كۆمپیوتەرەكەمان نامەیەكی ترمان دەداتیٚ:

**Directory: C:\TEMP**

**File Specifications: *.***

**** ?DFT3B30 TMP 37376 8-26-96 1:53p ...A**

**Starting cluster is unavailable. This file cannot be recovered with the UNDELETE command. Press any key to continue.**

# مامەڵە کردن لەگەڵ ناونیشانەکان

## یەکەم : فرمانە ناوەکیەکان

### 1- فرمانی دیاریکردنی ڕێرەوێك / چەند ڕێرەوێك PATH

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی:** ئەم فرمانە بەکاردەهێنین بۆ دیای کردنی ڕێڕەوێك یان چەند ڕێڕەوێك لە DOS بۆ گەڕان بەدوای بەرنامەیەك یان فایلێك کە حازر (موجود) نیە لە ناونیشانەی ئێستا . وە ئەم فرمانە مامەڵە دەکات(یتعامل) لەگەڵ فایلە تەنفیزیەکان کە کۆتاییان هاتووە بە پاشگری EXE. , BAT. , COM. .

**جۆری فرمان :** فرمانی ناوەکی.

**شێوەی گشتی :** [ ناوی ڕێڕەو ] ; [ناوی ڕێڕەو] PATH

**نموونە :**

واتە کاتێك من پرۆگرامێك تەنفیز دەکەم ڕاستەوخۆ لە کویێ Setup ببێت

A> PATH \ PROGRAMS

A> PATH \ DOS

A> PATH \ DIS ; B: ; C: / MAIN

### 2- فرمانی چوونە ناو فۆڵدەر و هاتنە دەرەوە لە فۆڵدەر CD

ئامانجمان لەبەکارهێنانی: فرمانی CD کورتکراوەی ووشەی

CHANGE DIRECTORY بەواتای گۆڕینی ئاراستە، واتە بەکاردێت بۆ چوونە ناو فۆڵدەکان و هاتنە

دەرەوە لە فۆڵدەرەکان، بۆئەوەی ئێمە بتوانین مامەڵە بکەین لەگەڵ ئەو فایلانەی کەلەناو فۆڵدەرەکاندا هەیە.

جۆری فرمان : فرمانی ناوەکی .

شێوەی گشتی : CD [ directory name ]

**نموونــە :**

بۆ چوونە ناو فۆڵدەرێك بەناوی DOS ئێمە ئەم فرمانە دەنووسین:

**D:\>CD DOS**

بۆ هاتنە دەرەوە لە فۆڵدەری DOS ئێمە ئەم فرمانە دەنووسین:

**D:\ DOS >CD . .**

یان **D:\ DOS >CD**

**تێبینی:**

1- CD. . بۆ هاتنە دەرەوە لەناو فۆڵدەر یەك لەدوای یەك، بەلاَم CD\ بەیەکجار لە فۆڵدەرەکان دێتە دەرەوە، بۆ

نموونە:

تەنها لە فۆڵدەری یەکەم (K) دێتە دەرەوە **D:\ DOS \K >CD . .**

بۆ جاری دووەم ئە فرمانە لە فۆڵدەری (DOS) دەردەچێ **D:\ DOS >CD . .**

بەلاَم: بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم دوو کردارە بەیەکجار بنووســـە:

**D:\ DOS\K >CD**

2- بـۆ تەئکیـد بـوون لـەناوی ئـەو فایلـەی کـە ئێمـە دەمانـەوێت بچـینە نـاوی سـەرەتا فرمـانی **DIR** بەکاربێنـە

**D:\>cd picture**

## 3- فرمانی دروستکردنی فۆڵدەر **MKDIR**

**ئامانجمـان لـە بـەکارهێنانی:** بـۆ دروسـت کردنـی فۆڵـدەرێکی نـوێ لەسـەر هاردەکـەت وە دەشـتوانین ئـەم کورتکراوەیە بەکاربهێنین **MD**

**جۆری فرمان :** فرمانی ناوەکی .

**شێوەی گشتی :** **MKDIR [ directory name ]**

یان **MD[ directory name ]**

# بەرنامەی نوسینی تێکست EDIT

---

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی :** ئەم بەرنامەیە بەکاردەهێنین بۆ دروستکردن و دەستکاری کردنی فایلی تێکستی **TEXT FILES**

**جۆری فرمان :** فرمانی دەرەکی .

**شێوەی گشتی : EDIT [ file name ]**

بۆ دروستکردنی فایلێکی نویٚ بەناوی **ABC.BAT** بەم شێوەیە دەبێت :

**C:\> EDIT ABC.BAT** ئەم شاشەیەمان بۆ دەردەچێت :

| FILE | EDIT | SEARCH | OPTIONS | HELP |
|---|---|---|---|---|

**ABC.BAT**

□□□□

و تـتم كتابــة الــنص داخــل مربــع الكتابــة المخصــص لــذلك و تحــدد المشــيره ( ـــ ) المكــان الــذى تــتم الكتابه فيه ، و سوف نستعرچ فيما يلي مكونات قوائم برنامج **EDIT** :

**<u>یەکەم : لیستی File :</u>**

لیستی **File** چەند فرمانێکی تری لەسەرە :

1– فرمانی **New** :

بەكاردێ بۆ دروستكردنی نوسراوێكی نوێ .

2- فرمانی **Open** :

بەكاردێ بۆ كردنەوەی نوسراوە تێكستیەكان .

3- فرمانی **Save** :

بەكاردێ بۆ خەزنكردنی فایلێكی نوێ كەپێشتر خەزنت نەكردووە یان بۆ خەزنكردنی دەستكاریكردنی نوێ لەسەر فایلێك كە پێشتر كردووەتەوە.

4- فرمانی **Save As** :

ئەم فرمانە بەكاردێ بۆ دووبارە خەزنكردنی فایلێك كە كراوەتەوە بەناوێكی لەگەڵ خەزنكردنی فایلە كۆنەكە .

5- فرمانی **Print** :

بەكاردێ بۆ لەچاپدانی تێكستی نوسراو لەگەڵ ئەو فرمانانەی مەوجودن لە ناو فایلەكە .

6- فرمانی **Exit** :

بەكاردێ بۆ هاتنە دەرەوە لە فایلەكە .



## دووەمً: لیستی Edit :

لیستی **Edit** چەند فرمانێکی تری لەسەرە :

1- فرمانی **Cut** :

بەکاردێ بۆ برینی بەشێك لەو نوسراوەی کەنوسیوتە .

2- فرمانی **Copy** :

بەکاردێ بۆ کرداری نوسخەکردنی ئەو فایلەی کەنوسراوە .

3- فرمانی **Paste** :

بەکاردێ بۆ دانان(Past) کردنی ئەو نوسراوەی کە پێشتر بڕیوتە یان نوسخەتکردووە بە هۆی فرمانی Cut یان فرمانی Copy.

4- فرمانی **Claer** :

بەکاردێ بۆ سڕینەوەی ئەو نوسراوەی کە نووسیوتە .

**تێبینی :**

بۆ بەکارهێنانی هەر فرمانێك لەو فرمانانەی پێشتر، دەبێت (سەرەتا) ئەو تێکستەی کە دەمانەوێت کردارەکانی( copy ,cut , past)لەسەر جۆبەجێ بکەین دەبێت دەگمەی Shift لەگەڵ سەهمی لای ڕاست یان چەپ دابگرین



## سێ یەم: لیستی Search :

لیستی Search چەند فرمانێكی تری لەسەرە:

1– فرمانی Find :

بۆكاردێ بۆ گەڕان بە دوای ووشەیەكی دیاریكراو یان كۆمەڵێك ووشە لەناو نوسراوی فایلەكە.

2– فرمانی Repeat last find :

بەكاردێ بۆ دووبارە گەڕان بەدوای ووشەیەك یان كۆمەڵە ووشەیەك كە پێشتر بۆ دواجار بەدوای گەڕاوی .

3– فرمانی Change :

بەكاردێ بۆ جێگۆڕكێ كردنی ووشەیەك یان كۆمەڵە ووشەیەك لەگەڵ شوێنی ووشەیەكی تر یان كۆمەڵێك ووشەی تر.




## چوارەم: لیستی Options :

لیستی Options چەند فرمانێكی تری لەسەرە:

1– فرمانی ...setting :

لێرەدا دەتوانین جۆری ئەو پۆرتەی کە دەگونجێت لەگەل کۆمپیوتەرەکەمان هەڵدەبژێرین

2– فرمانی **...Colors :**

بۆ گۆرینی رەنگی تێکستەکەو گۆرینی باگراوندەکەی.



# فایلەکانی پێچانەوە
# BATCH FILES

ئێمە دەتوانین فایلەکانی پێچانەوە بەهۆی هەموو کۆماندەکانەوە جێ بەجێ بکەین بەڵام ئەم کۆماندانەی کەلە خوارەوە دەیخوێنن ئەمانە بەشێوەیەکی زۆر و فراوان لە فایلەکانی bat. بەکار دەهێنرێن کە ئەمانەن:

## 1– فرمانی Echo

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی:** بۆپیشانادانی نامەیەك لەوکاتەی ECHO [ON] وە تێکدانی ئەو نامەیە لەوکاتەی ECHO[OFF].

**جۆری فرمان :** فرمانی ناوەکی .

**شێوەی گشتی :** ECHO [ON] [message]
ECHO [OFF] [ message ]

**نموونە :**

A> ECHO HELLO < ENTER >
ئێستا نامەیەکت نیشان دەدات بەناوی HELLO

## 2– فرمانی FOR

**ئامانجمان لەبەکارهێنانی:** ئەم فرمانە بەکاردەهێنین بۆ دووبارەکردنەوەی بەکارهێنانی فرمانێکی دیاریکراو، واتە فرمانی (FOR) بەکاردێ بۆ جێ بەجێ کردنی فرمانەکانی تر (Command)ی تری دۆس بە دووبارەکردنەوەی بۆ چەند فایلێك، وەکو کۆماندەکانی type و del و echo و هتد.......

جۆری فرمان : فرمانی ناوەکی .

شێوی گشتی : FOR %X IN (set) DO COMMAND %X

یان : FOR %%X IN (set) DO COMMAND %%X

لەکاتێکدا:

X : واتە Hexadecimal واتە 16حەرف دەگرێتەوە لە 1 – 9 وە A – F دەشتوانی بنووسی +

set : ناوی فایلەکە یان قیمەتێکی دیاری کراوە

Command : هەر فرمانێك لە فرمانەکانی دۆس (سیستەمی ئیشپێکردن)

نموونـــە :

```
D:\>md test
D:\>cd test
D:\ test >edit data.txt ------- write in------->muhamd
D:\ test >edit data1.log ----- write in------->C4kurd
```

پاشان بنووسە

```
D:\ test >for %x in (data.txt  data1.log) do type %x
```

یان بنووسە:

```
D:\ test >for %+ in (data.txt  data1.log) do type %+
```

تیبینی: بۆ پیشاندانی ناوەرۆکی هەموو ئەو فایلانەی کۆتاییان هاتووە بە پاشکری (.txt) پێکەوە دەنوسین:

```
D:\ test >for %x in (*.txt) do type %x
```

تیبینی: وەئیمە دەتوانین لە جیاتی کۆماندی (type)کۆماندەکانی تر بەکاربهێنین:

بۆ نموونە: بۆ ڕەشکردنەوەی ناوەرۆکی هەموو ئەو فایلانەی کۆتاییان هاتووە بە پاشکری (.txt) پێکەوە دەنوسین:

```
D:\ test >for %x in (*.txt) do del %x
```

نموونەی تر:

```
D:\ >for /L %x in ( 0 , 2 , 16 ) do echo %x
```

/L بەواتای Loop، واتە لە 0 تاوەکو 16 بڕوات و دوو دوو زیادبکات

نموونەی تر:

**D:\ >for /d %x in ( 0 , 2 , 16 ) do echo %x**

**/d** واتە تەنها ئەو سێ ژمارەیە کە لە نێوان کەوانەکەی سەرەوە نوسراوە، واتە 0 و 2 و 16

نموونەی تر:

بۆ پیشاندانی ناوەڕۆکی هەموو جۆرە فایلێك کەلەناو فۆڵدەری **K** هەیە لە هاردی **D:** دەنوسین:

**D:\ > FOR %+ IN ( K*.*) DO TYPE %+**

## چۆنیەتی بەکارهێنانی for لەناو فایلی batch:

**نموونـــە1:**

**D:\ >edit test.txt ---- لەناوی بنووسە --->**Kurdistan

**D:\ >edit test1.bat ------->لەناوی ئەم نوسراوەی خوارەوە بنووسە پاشان خەزنی بکە**

```
@echo off
For %%x in (test.txt) do type %%x
```

پاشان بنووسە:

**D:\ >test1**

**دەبینین ووشەی** Kurdistan مان نیشان دەدات .

**نموونـــە2:**

**D:\ >edit g1.bat ------->لەناوی ئەم نوسراوەی خوارەوە بنووسە پاشان خەزنی بکە**

```
@echo off
For /d %%x in (0,2,16) do echo %%x
```

پاشان بنووسە:

**D:\ >g1**

**دەبینین تەنها 0 و 2 و 16 مان نیشان دەدات هەروەکو پێشتر باسمان کرد**

چەند کۆماندێکی تریش وەکو , Echo, label, vol, goto, pause, title, color , pushd , popd, find prompt ,start ,……..etc

# لەگەل دەیان کۆماندی تر چاوەروان بن لە 2 MS-DOS

## بەم زووانە........؟؟؟؟؟؟؟؟؟!